أبو الحسن الندوي

# هەڵگەڕانەوەیەو ...

# ئەبوبەکری بۆنیە

نوزاد

وەرگێرانی

ئامۆژگار بەرزنجی



١٤٢٦ هەولێر ٢٠٠٥



هەڵگەڕانەوەیەو ...

ئەبوبەکری بونیە

# هەڵگەڕانەوەیەو ...

# ئەبوبەکری بۆنیە


نوسینی

أبوالحسن الندوي

وەرگێڕانی

ئاموژگار بەرزنجی



تەفسیر

١٤٢٦ك هەولێر ٢٠٠٥ز

ناوی کتێب بە عارەبی: ردة.. ولا أبوبكر لها

ناوی نوسەر: أبو الحسن الندوي

ناوی کتێب بەکوردی: هەڵگەڕانەوەیەو.. ئەبوبەکری بۆ نی‌یە!

ناوی وەرگێڕ: ئامۆژگار بەرزنجی

چاپ و بڵاوکردنەوەی: نوسینگەی تەفسیر/ هەولێر

کۆمپیوتەر: نوسینگەی تەفسیر

خەت: نەوزاد کۆیی

نۆرە و ساڵی چاپ: یەکەم ١٤٢٦ك ٢٠٠٥ز

تیراژ: ٢٠٠٠ دانە

ژمارەی سپاردن: ١١ ساڵی ٢٠٠٥

التفسير
هەولێر- شەقامی دادگا- ژێر ئوتێلی شیرین پالاس
ت: ٢٢٢١٦٩٥-- ٢٢٣٠٩٠٨- ٢٥١٨١٣٨
مۆبایل: ٢٢ ٥١ ٤٦٠ ٠٧٥٠ — ٩١ ٧٢ ١٣٨ ٠٧٧٠
tafseeroffice@maktoob.com
altafseer@hotmail.com

((ئەمە گەورەترین کێشەی جیهانی ئیسلامییە، گەورەترین گیروگرفتی نەتەوەی ئیسلامە، هەڵگەڕانەوەیەکەو بڵاو دەبێتەوە هێرش دەباتە سەر کۆمەڵگای ئیسلامی کەچی سەرنجی کەس ڕاناکێشێ و زانایانی ئاینیش هیچ غەمی بۆ ناخۆن ، پێشینان وتویانە: (قضیة ولا أبا حسن لها) واتە کێشەیەکەو (ئەبو حەسەن)[1]ی بۆ نییە، منیش دەڵێم (ردة ولا أبا بکر لها) واتە هەڵگەڕانەوەیەکەو ئەبو بەکری بۆ نییە.))

**"دانەر"**

---

[1] ئەبو حەسەن : واتە ئیمامی عەلی خوا لێ ی رازی بێ

بسم الله الرحمن الرحيم

# پێشەکی وەرگێڕ

مێژووی ئەم نامیلکەیــە دەگەڕێتــەوە بــۆ ســاڵی ١٩٨٠ لــەو کاتــەدا برادەرێك کە ناوی کاك عبدالکریم[١] بوو و هەڵدەستا بە بردنی دەستنووســە ئیسلامییە کوردییەکان بۆ وەزارەتی راگەیاندن ، بۆ وەرگرتنی ئیجازەی لە چاپ دان. کاتێ کە کاك عبدالکریم ئەم نامیلکەیەی برد بۆ وەزارەت پــاش ماوەیەك وەڵامەکەی هێنایەوە و گوتی : بە داخــەوە ئیجـازەی لــە چـاپ کردنیان نەداوە. پاشــان دوای ماوەیــەك چــووم بــۆ لای مامۆســتایەك کــە بەرێوەبــەری قوتابخانــەی ســەرەتایی بــوو، ئــەویش کتیبێکــی رەســمی بــۆ دەرهێنام کە لە بەرێوەبەرایەتی پەروەردەی (حکومتــی بەعســی پێشــوو) دەرچوو بوو و ئاراستەکرابوو بۆ گشت قوتابخانە و کتێبخانــە گشــتییەکان نــاوی جۆرەهــا کتێــب و نامیلکــەی تێــدا بــوو کــە هــەموویان قەدەغــەکرابوون ، کــە زۆر لەمانــە کتێبــی ئیســلامی بــوون لــە گــەڵ هەرکتێبێکیش هــۆی قەدەغــەکرانی بــاس کرابــوو. داواکرابــوو بــە هیــچ شێوەیەك ئەو کتێب و نامیلکانە بڵاونەکرێنــەوە و ئەگــەر هــەبێتیش ئــەوا دەبێت لە کتێبخانەکان دەربهێنرێت یــەك لــەو کتێبانــەی کــە یاســاغ و قەدەغە کرابــوو ئــەو نامیلکــەی بــوو کــەوا ئێســتا لەبــەر دەســتاندایە نوسرابوو( دەستنووسی " هەڵگەڕانەوەیە و ئەبوبــەکری بۆنییــە " کــە وەر گێردراوەتە سەر زوبانی کوردی و لە گەڵ ئەسڵەکەی بەعەرەبی کەبــە نــاوی "ردة و لا ابابکر لها" یە و کە نووسەرەکەی ناوی "ابوالحسن الندوی" یــە و

---

[١] کاك عبدالکریم لە ساڵی ١٩٨٨ لە کیمیابارانەکەی هەڵەبجە شەهید بوو.

هەر دووکیان ، دەستنووسەکە و دانە عەرەبییەکەی یاساغن ، چونکە ئەم کتێبە دژی پێشکەوتن و شارستانیەتە ...هتد ).

جا لەوانەیە پرسیار بکرێت ئایا پاش ئەم ماوەیە پێویست دەکات ئەم کتێبە لە چاپ بدرێت؟.منیش دەڵێم بەڵێ . دیاردەی هەڵگەڕانەوە کە نووسەر پێش پەنجا ساڵ لیٚ ی دواوە و ئیمڕۆ بە شێوەیەکی بەرچاوتر لە جاران سەری هەڵداوەتەوە. ئیمڕۆ ، دوای هێرشی خاچ پەرستان بۆ سەر جیهانی ئیسلامی ، هەڵگەڕانەوە لە زۆر ڕوو خۆی دەردەخات کە زەقترینیان ئەمەی نووسەر لیٚ ی دواوە دەمارگیری بۆ سەردەمی پێش ئیسلام و شانازی کردن پیٚ ی . بیٚ گومان ئەمەش لە بار و زروفێکدا رودەدات کە دەسەڵاتی بێگانە لە ناوماندا بڵاو بۆتەوە. ئیمڕۆ هێرشێکی رێکخراو و بەرنامە دارێژراو هەیە بۆ بەربەرەکانیٚ کردنی ئیسلام لە هەموو سوچێکەوە. ڕۆژانە دەیان بوختان و درۆ و دەڵەسە هەڵ دەبەستریٚ بۆ ئیسلام ، بەشێکیان کۆنە و سواوە و بەشێکیان نویٚ . دوێنی بە ناوی کۆمۆنیزم سەرسەختانە دژایەتی ئیسلام دەکرا کەچی بە پشتیوانی خوا کۆمۆنیزم هەرەسی هێنا و باوی نەما . ئەمجارەیان هەندێك لە کۆمۆنیستانی دوێنی ی موفلیس و بێچووە عیلمانیە نوێیەکان لە ژێر پەردەی عیلمانیەت و مۆدێرینیزم هەستاون بە خزمەت کردن بە بێگانە . هەروەکو سید قوتب دەڵی: عیلمانییەکان لە کۆمۆنیستەکان خەتەرترن چونکە عیلمانییەکان دەڵێن ئێمە دژی ئاین نین و ڕێزی لیٚ دەگرین ، بەم پێیە سۆزی ئاینی لەدڵی خەڵکدا دەمرێنن . کەچی کۆمۆنیستەکان خۆیان بە ئاشکرا دەڵێن ئێمە دوژمنی دینین . بەم شێوەیە خەڵك لێیان دەرەونەوە.سەید قوتب نزیکەی پێش پەنجا ساڵ ئەمەی گوتووە، کە ئەوکاتە کۆمۆنیزم لەتۆغیانی دابوو . بەڵام ئەم عیلمانییەکانی بە پڕ

مەترسی تر دادەنا .

عیلمانییەکان ئیمڕۆ لە زۆر مەیدانەوە بەربەرەکانیٚ ی ئیسلام دەکەن زۆر بابەت دەهێننە گۆڕیٚ . ڕۆژنامەکان ئیمڕۆ هیچ ڕۆژێک نییە جۆرەها نوسین بلاٚونەکەنەوە کە هەمووی مەبەستی دوورخستنەوەی خەلکٚە لە ئیسلام . دەستکاری کردنی بەرنامەی پەروەردە و فێرکردن لە قوتابخانەکان . بلاٚوکردنەوەی ناسیونالیزمی شوٚڤینیزم و ڕەگەزپەرستی و دژایەتی کردنی گەلانی تر . ڕوخاندنی ئەخلاق و رەوشت ئەویش بەهوٚی بلاٚوکردنەوەی ڕووتی و بەڕەلاٚیی لە ڕێگەی رادیوٚ و تەلەڤزیوٚن و ئینتەرنێت . زیندووکردنەوەی مەجوسیەت و ئاگرپەرستی و مەزهەبە کوٚنەکانی وەکو مانیزم و ئیتر . دەرهێنانی هەموو روخسارێکی ئیسلامی لە کوٚمەلگٚا لە ناو هێنانی منالٚ و سەلام کردن و هەلسٚ وکەوت .

هێرش کردنە سەر ئایین و هەر جوٚرە بیروڕاو ڕەووشت و بایی یەك کە لە ئایینەوە سەرچاوەی هەلقٚولاٚبیٚ ، ئەمانە هەمووی نمونەی بەربەرێکانی کردنی ئیسلامن ، تەووژمێکی ڕێکخراو و جیهانییە بە شێوەیەکی بەرنامە داڕێژراو کاری لە سەر دەکرێت ، ماسوٚنییەتی جیهانی لە پەنای پەردەوە کارەکانی ڕێك دەخات . بوٚنمونە لە ڕوٚژئاوا ئەگەر سیاسەتمەدارێك بە بەردەوامی بچێت بوٚ کەنیسە ئەوا دەزگا ماسوٚنییەکان لیٚ ی دەکەنە هەراو ناوی بەد دەکەن و دەلێٚن ئەو پیاوە سیاسییە باوەڕی بە ئایین هەیە و لە گەلٚ عیلمانییەت ناگونجیٚ و داوا لە خەلکٚ دەکەن لە کاتی هەلبٚژاردن دەنگی بوٚ نەدەن . لە تورکیاش کە بوٚتە پێشەنگی عیلمانییەت ئەم دیاردەیە بە ئاشکرا دیارە ، کە تێیدا ماسوٚنییەت هێلکەی تێداکردووەو فەرخەیەکی زوٚری لیٚ داناوە. ئەمە لە ڕوٚژئاوا ، لە ناو خوٚشمان هەمان دار و دەستەی ماسوٚنییەت ئەگەر یەکێك موسلمٚانی راستەقینە بێت ئەوا بە

ئیسلامی تاوان بار دەکرێت ، ئەمە لەناو جەرگەی وولاتـــی ئیسـلامی کـە کوردسـتانە روودەدات ، هــەموو دروشـــم و شــیعارێکی کــۆن و نــویَ هەڵبگیرێت ئەوا شیاوە ، بەلاّم نابیَ بە هیچ جۆرێك ناوی ئیسلام بـهێنرێت

ئا ئەمەیە بار و دۆخی ئێستامان کـە زۆربـەی خـەڵك خـەریکن بـو خـۆ دەوڵەمەندکردن و غەمێك بۆ دینەکەیان ناخۆن بـیَ گومـان ئەمانـە لـە بۆشاییدا روونادات ، ئەمە لە کاتێکدا روودەدات کە هێزەکانی جیهانی دژ بە ئیسلام بارگە و بنەگەیان لـە زۆر لـە وولاتـانی ئیسـلامی کردۆتـەوە و داگیریان کردووە ، یاخود چەند کەسانێکیان هێناوەتە سەرتەخت کە بـە گوێرەی ویست و مەرامی ئەوان کاردەکەن قـەرەبوو کردنـەوەی ئـەو بـار ودۆخەی ئێستامان ئەرکێکی زۆری دەویَ ، بۆیە ئیمـرۆ زیـاتر لـە دوێنـیَ ئەوانەی غەمخۆری ئیسلامن پێویستە هەموو بکەونـە کـار و هەرکـەس لـە شوێنی خۆی و بە پیَ ی توانا و ئەوەی لە دەستیان دێت بۆ بەرزکردنـەوەی وشەی خواو چەسپاندنی ئایینەکەی لەناو کۆمـەڵ هـەوڵ بـدەن کۆششـی چاکەخوازان پێویستە هەموو گۆڕەپان و ناوەندێك بگرێتەوە و کـەس کـاری ئەوی تر بە کەم نـەزانیَ ئیمـڕۆ زیـاتر لـە جـاران ئـەم نامیلکـە و ئـەو بابەتانەی کە دەیخاتە بـەر ڕوو پێویسـتە کـاری لەسـەربکریَ و چـارەی بـۆ بدۆزرێتەوە لەبەر ئەم هۆیەش بوو دوای ئەم هەمووساڵانە بەڕاستمان زانی لە چاپی بدەین و بلاّوی بکەینەوە.لە دواییدا سوپاسی هەموو ئەو دۆسـت و برایانە دەکەم کەلە کاتی خۆی هەڵساون بـە نووسـین و پێداچوونـەوەی ئەم نامیلکەیە ، خوای گەورە پاداشی چاکەیان بداتەوە و هەروەها لـەخوای گەورە دەپاڕێینەوە کە ڕێگای ڕاستمان نیشان بـدات و وابکـات کارەکانمـان هەر بۆ ڕەزامەندی ئەو بێت

**ئامۆژگار بەرزنجی**

# وتەی دانەر

ئەم وتارەی کە لەبەر دەستی خوێنەرانە، بۆ یەکەمجار لە "پێشـەکی"ی گۆڤاری "المسلمون" کـە لـە "جنێـف"[2] دەردەچـوو بـە ناونیشـانی (ردة جديدة) بڵاوکرایـەوە، واتـە هەڵگەڕانەوەیـەکی نـوێ، پاشـان لـە شـێوەی نامیلکەیەکی بچووك لە چاپ درا ، ئیدی لەو دەست بۆ ئەو دەستی دەکـرد و یەك لە دوای یەك لەم لا و لەو لا لە چاپ دەدرا ، گۆڤار و ڕۆژنامـەکان بڵاویان دەکردەوە، تا لە پایتەختی هـەندێ وڵاتـە ئیسـلامییەکان هـەزاران دانەی لێ کەوتە بازاڕەوە، وای لێهات ئەم وتارە لە هەموو نووسین و وتـار و نامیلکـەکانی دیکـەی ئـەم نووسـەرە زیـاتر بـڵاو بێتـەوە لـە جیـهانی ئیسلامیدا.

لەوانەیە نهێنی بڵاو بوونەوەی ئەم وتارە بە زۆری و بایەخ پێدرانـی لـە لایەن بانگکەران و خاوەن بیری ئیسلامی لەبەر ئەوە بێت ، کە ئەم وتـارە واقیعی جیـهانی ئیسـلامی زۆر بـە وردی و جوانـی دەخاتـە پێـش چـاو، بەتایبەتی چینی ڕۆشنبیر، هەروەها لـە دەمـاری هەسـتیاری دەدات ، جـا هەر شتێکیش ئەو نرخەی هەبێت شایەنی ئەوەیە دەروون و ژیریی خەڵك بۆ خۆی رابکێشێ و بیرۆکەو بیروڕای خەڵك لە خۆی نزیـك بکاتـەوە، دەنـگ دانەوەیەکی باشی هەبێت لە نێوان ئەو ناوەندانـەی کـە پـەیوەندییان پێـوە هەیە.

---

[2] ئەمـەش دوو پێشـەکی بـوون لـە گۆڤـاری "المسـلمون" بـڵاو کرانـەوە سـاڵی ١٣٧٨ك یەکەمیان بە ناونیشانی (ردة جديدة) دووەمیـش بـە ناونیشـانی (دعـوة جديدة).

وەك بلّی ی ئەمانە لەسەر بەلّێنێك بووبن لە گەلّ یەكتری لە هەمان کاتدا ئەم وتارە بیر هات و هەست و توێژینەوەیان دەر بڕێ.

لێرەدا دەبێ دان بەوەدا بنێین کە بیری بنەڕەتی ئەم وتارە بەندێك لە بەندەکانی ئەو کتێبە[٣] بە نرخەی (قورئان و زانیاری نوێ)ی مامۆستای موسلّمانی بەڕێز دکتۆر (رفیع الدین) ڕابەری کۆڕی ئیقبال ((Iqbal Academy)) لە " کەڕاچی " باسی کردووە، جا لەم تاقیکردنەوەو ڕووداوە نوێیەو واقیعە سەیرە دەدوێ ، ئەویش هەلّگەڕانەوەی چینی ڕۆشنبیری نەوەی ئیسلامی ئەمڕۆیە کە بە ڕۆشنبیری جیهانی کاریان تێکراوە، کە ئەم ڕووداوەش زۆر جیایە لەگەلّ ڕووداوە هەلّگەڕانەوە باوەڕ(عقائد)ییەکانی دیکەی مێژوو، کە موسلّمانەکان زانیبێتیان و لە مێژووشدا تۆمار کرابێت ، جا ئەم وتارە مەودای گەورەو قوولّ و کاریگەری توندی ئەم ڕووداوە لەسەر واقیعی کۆمەلّگای ئیسلامیی هاوچەرخ پیشان دەدات ، کە چ مەترسییەکی هەیە لەسەر دواڕۆژی ئیسلام و موسلّمانان ، ئەم هێمایە ڕوونە (واتە ئەم وتارە) چەندەها ئاسۆی نوێ و فراوانی بۆ بیر کردنەوە کردەوە ، نووسینی دەربارەی ئەم بابەتە زیاتر کرد، ئەم وتارەش لە کاتی خۆیدا هات و هیچ ماندوو بوونێکی فیکری و هۆشی پێنەدەویست ، وای نەدەخوازی نووسەر قەلّەمی خۆی پێوە ماندوو بکات و سەری خۆی پێیەوە بێشێنێ.

هەروەها پاش بلاّو کردنەوەی ئەم وتارە و ئاگادار بوونەوەی زۆر لە برایان و هاوڕێیان لیّ ی، هەنگاوێکی مەردانە لەم بارەیەوە نرا ، ئەویش

---

[٣] ئەم کتێبە لە ڕاستیدا بە زوبانی ئۆردۆ نووسراوە ، بەلاّم هەندێ لە بەشەکانی بۆ زوبانی عەرەبی وەرگێڕدراوە و لە گۆڤاری (البعث الإسلامي) بلاّوکراوەتەوە.

به ڕێکەوتنی ئەوان (واتــە ئـەو هــاوڕێ و برایانــە) لەســەر پێـك هێنــانی مەڵبەندێك بۆ دانان و وەرگێڕان و بڵاو کردنەوە کـە لەبـەر ڕۆشـنایی ئـەم وتارە بڕوات بەڕێوە، خۆی تەرخان بکات بۆ بەدی هێنانی ئـەو بیرۆکەیـەی ئــەم وتــارە لیّ ی دواوە، ئــەویش بەرهــەم هێنــانی ئـەدەبێکی ئیســـلامی پتەوبێت ، بەمەرجێك ناوەڕۆکەکەی لەسەر بنەڕەتێکی زانستی داڕێژرابێت ، بە گیانێکی بانگ خوازی تێر کرابێــت ، گـرێی دەروونــی و گــیروگرفتی گەنجە ڕۆشنبیرەکان لە جیهانی ئیســلامی چارەســەر بکـات ، لەبـەر ئـەوە (کۆڕی زانیاری ئیسلامی) لە "لەکنۆ" لە هینــد ســاڵی ١٣٧٨هـ-١٩٥٩ز هاتە کایەوە بە پشتیوانی خوا توانی چەند کتێب و نامیلکەیەك بــە چـوار زوباندا دەربکات ئەویش عەرەبی و ئۆردۆ و ئینگلیزی و هیندی کە نــرخ و بایەخێکی زانستی و بــانگ خوازییــان هــەبێت و زۆر لەوانــە بـۆ زوبـانی تورکی و فارسی وەرگێڕدراون و هەروەها بۆ زوبانی وڵاتە ئیســلامییەکانی دیکەو نائیسلامییەکانیش.

جا ئەمەش چاپێکی ترە لەم وتارە پێشکەشــی خوێنــەرانی دەکــەین ، خاوەنەکەشی خۆشحاڵی خۆی دەردەبڕێ بۆ هەر جارێك کە چــاپ بکرێــت و لە هەر سووچێك لە سووچەکانی جیهانی ئیسلامیدا بێت و بە هەر زوبانێك لە زوبانەکان بێت ، هەروەها خۆشحاڵ دەبێت بە بڵاو کردنەوە لــە گۆڤــار و ڕۆژنامەکان.

(فرب مبلغ أوعی من سامعٍ)

**أبو الحسن علی الحسنی الندوی**

کۆڕی زانیاری ئیسلامی

ندوة العلماء لەکنۆ (هیندستان)

١٧ی ڕەجەب ١٣٩٤ کۆچی- ٧ی تەمموزی ١٩٧٤ زایینی.

# هەڵگەڕانەوەیەو... ئەبوو بەكری بۆ نییە!!

## هەڵگەڕانەوەی نوێ

مێـژووی ئیسـلام زۆر ڕووداوی هەڵگەڕانـەوەی جۆراوجـۆری دیـوە. ڕوونترین و سەخت ترینیشیان هەڵگەڕانەوەی هـۆزە عەرەبـەكان بـوو، كـە پاش وەفات كردنی پێغەمبەر ﷺ ڕوویدا، ئەو هەڵگەڕانـەوە گـەورەی كـە ئەبو بەكری صدیـق ﷺ ، بـەهۆی بـاوەڕە پتـەوە مێژووییەكەیـەوە پێـش ئەوەی پەرە بسێنێ زیندە بە چاڵی كرد.

هەروەها بزووتنەوەی بە گاور كردن (التنصير) كە لە ئیسپانیادا -پاش دەرپەڕاندنی موسـڵمانەكان- بـڵاو بـۆوە. یـان وەك ئـەوەی لـەو وڵاتانـەدا ڕوویدەدا كە دەوڵەتە ڕۆژئاواییە (مەسیحی) یەكان خستبوویانە ژێر ڕكێفـی خۆیانـەوە كـە قەشـەو نێرراویـان تێـدا قیـت ببوونـەوە. یـان مەسـەلەی هەڵگەڕانەوەی چەند دەروون لاواز و بێ مێشكێك كە ئـایینی (براهمـی) و (ئاری)یان لە هیندستان وەرگرت بەڵام ئەمەش ڕووداوێكە و بە دەگمـەن ڕوودەدات لە ڕاستیدا، مێژووی موسڵمانان هەڵگەڕانەوەیەكی گشتیی بە خۆیەوە نەدیوە جگە لە ئیسپانیای بەد بەخت- ئەگەر بگونجێ بـەویش بوترێ" هەڵگەڕانەوە" وەكو هەندێك لە مێژوو نووسەكان دانیان پێدا ناوە.

ئەم جۆرە ڕووداوانەش دوو جۆرە سیفەتییان تێدا بەدی دەكرێ:

یەكـەمیان: دەربڕینـی ڕق و كینـەو نـاڕەزایی زۆر لـە لایـەن موسڵمانەكانەوە.

دووەمیان: دابڕان لە کۆمەڵگەی ئیسلامی.

واتە هەرکەسێك کە لە ئایینی خۆی هەڵدەگەڕایەوە، دەکەوتە بەر لێشاوی نارەزایی توندی موسڵمانەکان ، بەو هەڵگەڕانەوەیەش لە کۆمەڵگای ئیسلامییان دادەبڕاند. بە جۆرێك کە هەموو پەیوەندییەکی سۆز و خزمایەتی و دۆستایەتی موسڵمانانی لیٚ دادەماڵرا . چونکە هەڵگەڕانەوە بریتیە لە گواستنەوە لە کۆمەڵگایەکەوە بۆ کۆمەڵگایەکی تر و لە ژیانێکەوە بۆ ژیانێکی تر. بۆیە کەس و کاری هەڵگەڕاوەکە، دووریان دەخستەوەو پەیوەندییان لەگەڵدا دەپچڕاند ، خێزانەکەشی دەری دەکرد و هیچ مافێکی ژن هێنان و شوو کردن و میرات گرتن و برایەتی نەدەما.

بزووتنەوەکانی هەڵگەڕانەوە گیانی بەرگری و بەراوورد کردنی ئایینی لە نێو موسڵمانەکان بەرپا دەکرد و وای لیٚ دەکردن و کە ئیسلام بپارێزن ، هەر ولاتێك کە رووداوی هەڵگەڕانەوەی تێدا بەرپا بووبیٚ ئەوا سۆزی زانا موسڵمانەکان و نووسەرانی موسڵمانی دەهەژاند و زیاتر هانی دەدان ، بۆ خۆ قایم کردن و بەرەنگاری کردنی ئەو رووداوانەو گەڕان بە دوای هۆیەکانی ئەم کارەساتانە لە لایەك و پیشان دانی رووی جوان و قەشەنگی ئیسلام لە لایەکی دیکەوە، جا ئەوەی راستی بیٚ ئەم جۆرە کارەساتە موسڵمانەکانی دەهەژاند و دەبوو بە خولیای سەریان و ئیدی پیر و جوانی دەخرۆشاند، نەخوازە ئیسلام پەروەری تەواو و راستەقینە.

ئەمانە بوون ئەو نیشانانەی کە رووداوی هەڵگەڕانەوەیان پیٚ جیا دەکرایەوە، ئەگەرچی ئەم رووداو و کارەساتانە زۆر بە دەگمەن بوون و هیچ

کارێکی وایان نەدەکردە سەر ژیان . بەڵام لەم دواییەدا سەرتاپای جیهانی ئیسلام دووچاری بزووتنەوەیەکی توندی هەڵگەڕانەوە بووە کە لە هەموو بزووتنەوەکانی دیکەی پێش خۆی ترسناك تر و بەر بڵاوترە لە توندی و لە بڵاوی و لە قووڵی و لە بەهێزیدا، بەجۆرێك کە وڵات نەماوە لە داوی ئەم بزووتنەوەیە رزگاری بووبێ و بەدەگمەن خێزانی موسڵمان هەیە کەوا لە دەستی دەرباز بووبێت ، بەتایبەتی دوای هێرشە رامیاری و رۆشنبیرییەکەی ئەوروپا بۆ سەر رۆژهەڵاتی ئیسلامی ، هێرش و لێشاوێکی ئەوتۆ کە لەمێژووی ئیسلامدا بە گەورەترین هەڵگەڕانەوە دەژمێردرێت، لە سەردەمی پێغەمبەرەوە ﷺ هەتا ئێستا!!.

جا با بزانین هەڵگەڕانەوە لە گۆشەی پێناسەو زاراوە و شەریعەتی ئیسلامدا مانای چییە؟!

هەڵگەڕانەوە: بریتیە لە گۆڕینەوەی ئایینێك بە ئایینێکی دی ، یا بیروڕایەك بە بیروڕایەکی دی و نکۆڵی کردن لەوەی پێغەمبەر ﷺ هێناوییەتی و پشتاوپشت[4] پێیان راگەیاندووین و بە پێویست زانراوە لە ئیسلامدا.

جا ئەو کەسەی هەڵدەگەڕایەوە چی دەکرد؟!

نکۆڵی دەکرد لە پەیامی پێغەمبەر ﷺ و دەبووە (فەلە) یا (جوو) یا (بەرەهمی) یان بە یەکجاری بڕوای بە هیچ ئایینێك نەدەهێنا و بێ باوەڕ دەمایەوە، نکۆڵی لە پەیامی پێغەمبەران و سرووش "وحی" و رۆژی

---

[4] پشتاوپشت: واتە بە (تواتر) کە بە شتێك دەڵێن زۆر کەس گێڕابێتییەوە و هیچ گومانی لێ نەکرێ.

دوایـی و زینـدوو بوونـەوە دەکـرد، تـا بـەم جـۆرە پێشـینان لـە مانـــای هەڵگەڕانەوە گەیشتبوون ، هەر بەم پێیەش ئەو کەسەی کە لە ئایینی خۆی هەڵ دەگەڕایەوە ئایینێکی دیکەی هەڵدەبژارد و دەچووە ئەو شـوێنەی کـە تێیدا لەگەڵ هاوەڵە نوێیەکانی پەرستن و داواکاری خۆیان تێدا ئـەنجام دەدا. بۆ نموونە: ئەوەی ببوایە (فەلە) دەچووە کەنیسە ، ئەوەی ببوایە (بەرەهمی) دەچووە پەیکەرگا یاخود پەرســتگا ، واتـە ئـەوەی کـە هـەڵ دەگەڕایـەوە خەڵکی هەموو دەیان ناسی و لـــە نێویـاندا ئاشـکرا دەبـوو و پەنجـەی بـۆ رادەکێشرا ، بەم جۆرە ئیتر موسڵمانان ئومێدیان لێ دەبـڕی و پـەیوەندییان لەگەڵدا نەدەما.

## ئەو فەلسەفەیەی کە ئەوروپا بۆ رۆژهەڵاتی رەوانە کرد

ئەو فەلسەفانەی کە ئەوروپا بۆ رۆژهەڵاتی رەوانە کرد ، لەسەر نکۆڵـــی کردنـی -إنكـار- و پشـت گـوێ خسـتنی بنچینـەکانی -أسـس- ئــایین دامەزرابوون ، نکۆڵی کردنی ئەو هێزە کاریگـەرەی کـە ئـەو بوونـەوەرەی خسـتۆتە کـارو و لـە نەبوونـەوە هێناویەتییـە کایـەوە و جڵـەوی هـەموو بوونەوەریشی بەدەستە (**ألا لَهُ الخَلْقُ وَالأَمْرُ**) ، نکۆڵی کردنی جیهانی نادیار -عـالم الغيـب- و سـروش و پەیامـەکان ، نکۆڵـی کردنـــی شـــەریعەتە ئاسمانییەکان ، نکۆڵی کردنـی نـرخ و بـایی بـە گیـانی و رەوشـتییەکان ، یاخود ئەوانـــەی لـە ژیـانزانی و پـەیدابوون و پەرەسـەندن دەکۆڵنـەوە، یـا ئەوانەی پـەیوەندییان بـە رەوشـت هەیـە و یـاخود بـە باسـی دەروونزانـی (سایکۆلۆجی)یەوە بەندن ، یانیش هەندێکیان کە بەندن بە بابەتی ئـابووری

و سیاسیی...، ئەوەی شایانی باسە ئەوەیە کە ئەم فەلسەفانە هەرچەندە جیاواز بن لە رەنگ و بۆو ئامانج و بناغەیاندا ، هەموویان لە خالێکدا یەك دەگرنەوە، ئەویش کەوا تیۆرێکی ماددی و رووتن دەربارەی ئادەمیزاد و بوونەوەر و لێکدانەوەیەکی ماددیین بۆ دیاردە و کردەوەکانیان.

ئەم فەلسەفانەش بەوەندە نەوەستان بەڵکو هێرشیان هێنایە سەر کۆمەڵگای رۆژهەلاتی ئیسلامی و چوونە ناخی دەروونییەوە ، ئەمەش بە گەورەترین ئایین گەری -الديانة- دادەنرێت کە پاش ئیسلام هاتبێت لە مێژوودا، کە لەهەموو ئایین گەرییەکانی دی زیاتر رەگی خۆی داکوتاو بلاوبۆوە، بەم جۆرە ئازیزترین رۆلەی ژیر و رۆشنبیری ولاتە ئیسلامییەکان شوێنی ئەم فەلسەفانە کەوتن ، قۆستیانەوە و دانیان پێدانا ، هەروەك چۆن موسلمانێك دان بە ئیسلامدا دەنێت و فەلەیەك دان بە مەسیحییەتدا دەنێ بە تەواویی ، جا ئەم لاوانە لە پێناوی ئەم ئایین گەرییە نوێیە گیانی خۆیان فیدا دەکەن و دروشمەکانی پیرۆز رادەگرن، فەرماندەو بانگ کەرانی ئەم ئایین گەرییە مەزن رادەگرن ، لە وتار و نووسینەکانیان دا بانگەوازی بۆ دەکەن.

هەموو شتێك کە لەگەلێدا نەگونجێ بە سووکی دەزانن و رێزی لێ نانێن جا ئەم شتانە هەر جۆرە ئایین و رێباز و ژیرییەك -عقليات-بن!.

هەر یەکێکیش دان بە رێبازەکەیان بنێت برایەتی لەگەلدا دەکەن، چونکە ئەندامەکانیان یەك نەتەوە و یەك خێزان و یەك ئوردوگان.

## ئایین گەریی بێ دینی

ئایا ئەم ئایین گەرییە چییە؟- هەرچەند ئەم چینە رازی نــین بــە "ئــایین گەریی" ناوی ببەن- بەڵام گرنگ ئەوەیە بزانین کە ئەم ئایین گەرییە بریتیە لە نکۆڵی کردنی داهێنەر و دروست کەری بوونەوەر (العليم الخبــير): کــە هەموو شتێکی بە هێند و رادەی خۆی دروست کردووە و رێگای گــوزەران و ژیانیشی پێ نیشان داون، هەروەها نکۆڵی کردنە لە زیندوو بوونــەوەو رۆژی حەشر و بوونی بەهەشت و دۆزەخ و پاداش و سزا، نکۆڵی کردنە لە پەیام و پەیامبەرەکان، نکۆڵــی کردنــە لــە یاســا "شــەریعەت"ە ئیســلامییەکان و سنووره شەرعییەکان ، نکۆڵی کردنە لەوەی کە پێغەمبەری مەزن نــێرراوی خوایــەو پێویســتە گــوێ رایــەڵی بکرێــت ، چونکــە رێگــەی هیدایــــەت و کامەرانی تەنیا بە پێڕەو کردنی ئەوە، نکۆڵی کردنــە لــەوەی کــە ئیســلام نەمرترین و دوا پەیامە کە بەختیاری دنیا و رۆژی دوایی دابــین دەکــات و بێ نموونەیە و چاکترین رێبازە بۆ ژیان و تەنها ئایینێکە کــەوا خــوا پــێی رازی بێت و جیهانیش بێ ئیسلام بەختیار نابێت نکۆڵی کردنە لەوەی کە دنیا بۆ ئادەمیزاد دروست کراوەو ئادەمیزادیش بۆ خوا

ئەمەیە ئایین گــەری ئــەم چینــە رۆشــنبیرە هەڵکــەوتووەی کــە جڵــەوی ژیانیان لە زۆربەی وڵاتە ئیسلامییەکان لە بن دەستە. ئەگەر چی ئەمانــە هەموویان یەك چین نین لە باوەڕ هێنان بەم شتانەو خوێــن گــەرمی بۆیــان ، چونکە تێیاندا هەیە کە بــاوەڕی بــەخواو بــە ئیســلام هەیــە بــەڵام ســیماو نیشانەو مۆرکی ئەم چینەی بەسەردا زاڵە، کە ئایین گەریی زۆربەی دەستەو سەرکردەکانی ئەم چینە بریتیە لە ئایین گەری ماددی و فەلســەفەی ژیــانی

ڕۆژئاوایی کە لەسەر بناغەی خوا نەناسیی "إلحاد" دامەزراوە. دەگەڕێمەوە دەڵێم: هەڵگەڕانەوەیەکەو سەرتاپای جیهانی ئیسلامیی گرتۆتەوەو، هێرشی هێناوەتە سەر زۆربەی ماڵ و خێزانەکان و زانستگاو کۆلیج و قوتابخانە ئامادەییەکان و دام و دەزگاکان کە هیچ خێزانێکی ئەوتۆ نییە یەکێك لە ئەندامەکانی سەر بەم کۆمەڵە بێباوەڕە نەبێ و خۆشی نەوێت و بەگەورەی نەزانێت ، -مەگەر ئەوەی خوا پاراستبێتی- خۆ ئەگەر یەکێ لەمانە بدوێنی ئەوا لە قسەکانیدا بۆت دەردەکەوێت کە باوەڕی بە خوا نییە ، یان باوەڕی بە ڕۆژی دوایی نییە ، یان باوەڕی بە پێغەمبەر ﷺ نییە ، یا باوەڕی بە قورئان نییە وەکو کتێبێکی نەمر و بەرنامەیەك بۆ ژیان ، ڕەنگە لە هەموویان ڕاستگۆتر بە جۆرێك بڵێت کە ئەو بیر لەو جۆرە مەسەلانە ناکاتەوە و هیچ گرنگییەکی ئەوتۆی پێ نادات!!

لە ڕاستیدا هەڵگەڕانەوەیە و کەچی سەرنجی موسڵمانەکانی ڕانەکێشاوە و هۆش و بیریانی نەخستۆتە کار ، چونکە خاوەنی ئەم هەڵگەڕانەوەیە ناچێتە " کەنیسە" یا " پەرستگا " تاکو ئاشکرا بێت و بناسرێت.. بە جۆرێك خێزانەکەی لیٚ ی ئاگادار نابێتەوە، بۆیە نە پەیوەندی لەگەڵدا دەبڕێت و نە دووری دەخاتەوە، بەڵکو بەردەوام تێیدا دەژی و ڕادەبوێرێ بەو مافانەی کە هەیەتی ، ڕەنگبێ دەسەڵاتی خۆیشی بەسەریدا بسەپێنێ ، کۆمەڵگاش گوێی پێ نادات و لیٚ ی ناپرسێتەوەو لۆمەی ناکات و دەری ناکات ، بەڵکو هەردەم تێیدا دەژی و تام لەو مافانەی خۆی وەردەگرێت و لەوانەیە زاڵیش بێ بەسەریدا و ببێتە سەرکردەی میللەت.

## هەڵگەڕانەوەیەکەو ... ئەبوبەکری بۆ نییە

ئەمە گەورەترین کێشەی جیهانی ئیسلامییە، گەورەترین گیروگرفتی نەتەوەی ئیسلامە، هەڵگەڕانەوەیەکە و بڵاو دەبێتەوە و هێرش دەباتە سەر کۆمەڵگای ئیسلامی کەچی سەرنجی کەسی بۆ راناکێشرێ و زانایانی ئایینیش هیچ خەمی بۆ ناخۆن.

لە پێشاندا دەیان وت: "قضية ولا أبا حسن لها" واتە کێشەیەکەو "أبو حەسەن"ی بۆ نییە، منیش دەڵێم "ردة ولا أبا بكر لها" واتە "هەڵگەڕانەوەیەو ئەبو بەکری بۆ نییە"، ئەمەش نە جەنگ و نە هەڵسانەوەو نە وورووژانی رای گشتیی دەوێ!، نە شۆڕش و نەتوند و تیژیشی دەوێ!، چونکە توند و تیژیی زیان دەگەیەنێت و دەبێتە هۆی وورووژانی . ئیسلامیش دادگاکانی پشکنین و ستەمکاری و چەوساندنەوە ناناسێت ، بەڵکو ئەم کێشەیە پێویستی بە هیممەت و ئارام گرتن و لێکۆڵینەوە هەیە.

## نهێنیی بڵاوبوونەوەی ئەم ئایین گەرییە

بۆچی ئەم ئایین گەرییە لە رۆژهەڵاتی ئیسلامیدا بڵاوبۆوە؟ بۆچی توانی هێرش بەرێتە سەر موسڵمانەکان لەماڵی خۆیاندا ؟! بۆچی توانی وا بەتوندی دەست بەسەر مێشك و دەروونی خەڵك دابگرێت؟ ئەم پرسیارانە هەموو پێویستییان بە بیر کردنەوەیەکی قووڵ و لێکۆڵینەوەیەکی ورد و فراوان هەیە!!..

جیهانی ئیسلامی له سه‌ده‌ی نۆزده‌هه‌م تووشی کزی و لاوازی هات له بانگه‌واز و بیروباوه‌ڕ و ژیریی و زانستدا.. به شێوه‌یه‌ك نیشانه‌ی پیری و شه‌که‌تی و ماندوو بوونی لیّ به‌دیار که‌وت ، به‌لاّم ئیسلام پیر بوون و کۆن بوون نازانیّ!!، چونکه ئیسلام نوێیه‌و هه‌موو رۆژیّ له‌گه‌لّ هه‌لاّتنی خۆردا لاو و نویّ ده‌بێته‌وه، به‌لاّم موسلّمانه‌کانن که‌وا پیر و بیّ هێز بوون ، به‌هۆی نه‌زانی و دووره په‌رێزییان له زانیاری و داهێنان و بلیمه‌تی و ژیرییدا . نه خوێن گه‌رمییه‌ك هه‌بوو له بانگه‌وازیدا و نه پیشاندانێکی جوان و رێك و کاریگه‌ر هه‌بوو بۆ ئیسلام و رووه‌جوانه‌که‌ی و په‌یامه پیرۆزه‌که‌ی مه‌گه‌ر به ده‌گمه‌ن . هه‌روه‌ها هیچ په‌یوه‌ندییه‌ك نه‌بوو له‌گه‌لّ لاوی رۆشه‌نبیر و کارکردنه سه‌ر ژیرییان ، که ئه‌و لاوانه نه‌وه‌ی دوا رۆژ و رۆلّه‌ی چاوه‌ڕووان کراون ، هیچ هه‌ولّدانێك نه‌بوو بۆ ئه‌وه‌ی تێیان بگه‌یه‌نن که ئیسلام ئاینی مرۆڤایه‌تییه و په‌یامێکی نه‌مره و قورئانیش ئه‌و کتێبه نه‌مر و موعجیزه‌یه، که شتی سه‌یری وای تێدایه و دوایی نایه‌ت ، سه‌رچاوه‌ی توێشوویه‌کی به‌رده‌وام و بیّ بنه و هه‌رده‌م نوێیه و کۆن نابێت. پێغه‌مبه‌ریش ﷺ گه‌وره‌ترین موعجیزه‌ی ئه‌م ئاینه‌یه، پێغه‌مبه‌ری هه‌موو نه‌وه‌یه‌کی ئێستاو داهاتووه و پێشه‌وای هه‌موو سه‌رده‌مێکه و شه‌ریعه‌تی ئیسلامیش نموونه‌یه له یاسادانان و ده‌گونجێت بۆ رۆیشتن له‌گه‌لّ ژیان و جیّ به‌جیّ کردن و سه‌رپه‌رشتی کردنی ئامانجه پیرۆزه‌کانی ، باوه‌ڕ و ره‌وشت و بنه‌ما و باییه گیانییه‌کانیش (القیم الروحیة) بناغه‌ن بۆ شارشتانییه‌تێکی په‌سه‌ند کراو و کۆمه‌لّگه‌یه‌کی نایاب.

جا شارستانییەتی نویێ تەنها هۆو ئـــامراز و ڕێگــەی بــە دەســتەوەیەو، فەرمایشــتی پێغەمبــەرانیش ســەرچاوەی بیروبــاوەڕ و خورەووشــت و ئــەو ئامانجانەیە، بۆیە شارستانێتیی هاوسەنگ و چاك جیێی چــاوەڕوانیی نییــە ئەگەر هاتوو هۆو ئامانجەکان پێکەوە کۆ نەکاتــەوە. ئـا لــەم ساتەدا بــوو ئــەورووپا هێرشــی هێنایــە ســەرمان بــەو فەلســەفانەی کــە فەیلەســووفە گەورەکان و ناودارەکانی زۆری پێوە ماندوو بــوو بــوون و لــە ئاکــامی ئــەو هۆنینەوەو توێژینەوانەی کـــە لــەم بارەیــەوە کردبوویــان ، بــە مۆرکێکــی زانستی فەلسەفی بۆیەیان کردبوو ، بە جۆرێك تەماشاکەر خــەیاڵی دەکــرد کە ئــەم قســانە ئــەنجامی کۆتــایی بــیر کردنــەوەی ئــادەمیزادن و کۆتــایی لێکۆڵینەوەو تاقیکردنەوەکانن و بەرهەمی ژیریی ئــادەمیزادن و هــەوێنی چــەندەها تێڕامــانینن ، جــا هــەندێکیان لەســـــەر تاقیکردنــــەوەو بینـــین دامەزرابوون، توێژینەوەش راستییەکەی پیشاندەدا ، هەندێکی تری لەســـەر گریمانکاری و"تحکم" و خەیاڵ و بۆچوون و ئەفسانە دامەزرابون کــە حــەق و ناهەقیان تێــدا بــەدی دەکــرا و هــەورەها هــەندێك راســتی ئێســتای تێــدا دەبیندرا ، وێڕای هەندێ زانستی و نەفامی و خەیاڵاتی شاعیری!، چونکــە شیعر تەنیا بە کێش و قافییەوە بەند نییــە، بــەڵکو خــۆی خســتووەتە نــاو فەلسەفەو زانستیش . جا داگیر کەرە ئەورووپاییەکان ئــەو فەلسەفانەشــیان لەگەڵ خۆیاندا بۆ هێنـــاین . ئیــتر ژیــریی و دەروونــی خــەڵکی بــۆ خــۆی ڕاکێشاو مل کەچ بوون بۆی و سەریان بۆ دانوانــد ، چیـــنی رۆشــەنبیریش ئەمەی قۆستەوەو قبووڵی کرد، کە تێیاندا هەبوو تێ ی دەگەیشت ، بـــەڵام ئەمانە زۆر کەم بوون و هەشیان بوو تێ ی نەدەگەیشتن ئەمانــەش زۆربــەی

زۆریان بوون . بەڵام هەر کەسێ باوەڕی پێ دەهێنا و بە سیحرەکەی کاری تێدەکرا وای دەزانی ژیریی و دانایی ئەوەیە کە باوەڕ بەمە بێنێ و بە دروشمی رۆشەنبیرە ئازادیخوازەکانی دەزانی . ئا بەم شێوەیە خوا نەناسی و هەڵگەڕانەوە لە ناوەندە ئیسلامییەکان بڵاو بۆوە، بێ ئەوەی سەرنجی باوکان و مامۆستایانی پەروەردەو خەڵکی خاوەن غیرەت رابکێشێت ، چونکە ئەوانەی هەڵگەڕابوونەوە کڕنوشیان بۆ بت نەدەبرد و قوربانییان بۆ تاغووت سەرنەدەبڕی ، کە ئەوانە نیشانەی کافر بوون و هەڵگەڕانەوە بوون لە سەردەمی دێرینا.

## دوو ڕوویی و خوانەناسی

هەڵگەڕاوانی کۆن لە کۆمەڵگای ئیسلامی دەردەچوون و دەچوونە ریزی کۆمەڵگای ئەو ئایین گەرییە نوێیەی کە تازە دانیان پێدا ناوە. زۆر بە ئاشکرایی و ئازایانە بیروڕای هەڵگەڕانەوەی خۆیان رادەگەیاند ، بێ ئەوەی گوێ بدەنە هەرشتێك کە رەنگە لە دەستیان بچێت لە ئەنجامی هەڵگرتنی بیروڕایە نوێیەکەیان . سوور نەبوون لەسەر مانەوە لە کۆمەڵگا کۆنەکە بۆ پارێزگاری کردنی ئەو ماف و بەرژەوەندییانەی کە هەیان بوو . بەڵام ئەوەی ئەمڕۆ پەیوەندی خۆی لەگەڵ ئایینی ئیسلام دەبڕێ ، پەیوەندی خۆی لەگەڵ کۆمەڵگای ئیسلامیدا نابڕێت ، ئەگەر چی کۆمەڵگای ئیسلامی تەنها کۆمەڵگایە بۆ ئادەمیزاد کە لەسەر بیروڕا دامەزرابێت ، ئەم کۆمەڵگایەش نایەتەدی تەنها لەسەر بیروباوەڕ نەبێت . بەم جۆرە هەڵگەڕاوانی ئەمڕۆ سوورن لەسەر مانەوەیان لە شوێن و پایەی خۆیان ،

تەنانەت جێگەی متمانەی ئەو کۆمەڵگایەن ، بەهۆی ئەو مافانەی کە ئیسلام پێ ی بەخشیون و ئەمەش بارودۆخێکی زۆر نامۆیە کە مێژووی ئیسلام هەرگیز بە خۆیەوە نەدیوە.

## دەمارگیرییە نەفامییەکان و ئایین گەرییەکانیان

هەندێك ئارەزوو و بنچینەی نەفامی هەن کە ئیسلام بە ئاشکرا بەرەنگاری کردوون و پێغەمبەریش ﷺ بە هەموو توانای خۆیەوە بەرەنگاریی کردوون ، وەك ئەو دەمارگیرییانەی کە لەسەر یەکبوونی خوێن، یا نیشتیمان، یا نەژاد دەوەستێت . جا ئارەزووی نەفامی زیادە لە پێویست ئەم دەمارگیرییە پیرۆز دەکات و پارێزگاریی دەکات و لە ژێر ئالآیدا دەجەنگێت و دەیەوێت کۆمەڵگای مرۆڤایەتی لەسەر ئەم دەمارگیرییە دابەش بکات ، تاوەکو ببێتە ئایین گەری و بیروباوەڕێك لەگەڵ مێشك و دەروون و گیان و ڕەوشتدا تێکەڵ ببێت و دەسەڵاتی بەسەردا بگرێ ، بێگومان ئەم دەمارگیرییە لە قوڵی و ڕەگ داکوتان و بەهێزی و بڵاویدا ململانێی ئایینەکان دەکات و مرۆڤ دەکاتە بەندەی خۆی و کۆششی پێغەمبەران ﷺ هەڵدەوەشێنێتەوە، ئەو ئایینەی کە خوا ناردوویەتی بۆ ئەوەی حوکمی ژیان بکات ، دەکاتە چەند پەرستن و هێمایەك و جیهانی مرۆڤایەتی دابەش دەکات بۆ چەند ئۆردوگای دژ بە یەك ، ئەو نەتەوەی کە خوای گەورە لە بارەی دا دەفەرموێت:

﴿ وأَنَّ هَذِهِ أُمَّتُكُمْ أُمَّةٌ وَاحِدَةٌ وَأَنَا رَبُّكُمْ فَاتَّقُونِ﴾ دەکاتە چەند نەتەوەی جیاجیا.

## بۆچی ئیسلام بەربەرەکانێ ی ئەم دەمارگیرییانە دەکات؟

پێغەمبەر ﷺ بە هەموو هێزێکی و بە بێ سڵ کردنەوە بەربـــەرەکانێ ی ئەو دەمارگیرییە نەفامییانەی کـردووە و خـەڵکی لێ ترسـاندووە و ئـەو دەرگایانەی داخستووە کە رەنگـــە ببێتــە هــۆی بـڵاو بوونــەوەی ، چونکـە ئایینێکی جیهانی واتە" ئیسلام " و نەتەوەیەکی یەك پارچــە مانــەوەی بۆ نییە لەگــەڵ ئــەم دەمارگیرییانــە. هــەروەها ســەرچاوەکانی شــەریعەتی ئیسلامی پڕە لە نــەفرەت لێ کـردن و رووڕەش کردنـی دەمارگـیری و ئـەو دەقانەی کە لەم بارەیەوە هەن ئەوەندە زۆرن لــە ژمــارە نایــەن ، جائــەوەی بەڵگە نەویستێك و سەرەتایەك لــە ئیســلام بزانێــت و سرووشــتی ئیســلام بزانێت یا سرووشـــتی ئایینــەکان بزانێــت ، دەزانــێ کــە ئیســلام بــە هیــچ شێوەیەك رێگە بەم دەمارگیرییانە نادات ، هەر یەکێك مێژوو بخوێنێتەوە و دوور بێت لە بۆچوون و راڕەوە رامیارییەکان دەزانێت کە ئەم دەمارگیرییانە لە کۆنەوە تا ئێستا گەورەترین هۆ بوون بۆ رووخان و کاول کردن و تێك دان و جیاکردنەوەی مرۆڤ لە یەکتری ، جا شتێکی گونجاو و چاوەڕوان کراوە بۆ مرۆڤێك کە هاتبێت بــۆ ئــەوەی جیــهان بکاتــە یــەك پارچــەو مــرۆڤ کــۆ بکاتەوە لە ژێر یەك ئــاڵا و یــەك بیروبــاوەڕ ، هــاتبێت بــۆ پێــك هێنــانی کۆمەڵگایەکی نوێ لەسەر بناغەی ئایین و بــاوەڕ هێنــان بــە پــەروەردگاری هەردوو جیهان و بڵاوکردنەوەی ئاشتی و ئاســایش و خۆشەویســتی و رێــك بوون لە نێوان ئەندامەکانی خێزانی مرۆڤایەتی ، تاکو بیان کاتە یەك لــەش . کاتێ یەك لە ئەندامەکانی ژان بکات هەموو پارچەکانی تــر بکەونــە ژان

گرتـن و نەخـەوتن و تـا لیٚ هـاتن ، شـتێکی زۆر گونجـاو و ئاسـاییە بـۆ مرۆڤێکی وا کە بە ئاشکرا بەرەبەرەکانیٚی ئەو جۆرە دەمارگیرییانە بکـات و ئەم کارەش بکاتە ئەرکی سەرشانی هەر یەکێك کە لە دوای خۆی دێت.

## تەکاندانی گەلانی ئیسلامی بۆ زیندووکردنەوەی ئەم دەمارگیرییانە

بەڵام جیـهانی ئیسـلامی پـاش هێرشـە رامیـاری و رۆشـەنبیرییەکەی ئەوروپا بۆ سەری کەوتە ژێر دەستی ئەو دەمارگیرییانە، دەمارگیری خوێـــن و نەژاد و نیشتیمان ، باوەڕی پـێ دێنـێ وەکـو مەسـەلەیەکی زانسـتی و راستییەکی بڕیار دراو و واقیعێکی ئەوتۆ کە دەرباز بوونـی تێـدا نـەبێت ، بە جۆرێك ئەم گەلانە زۆر بە شێوەیەکی سـەیر تـەکان دەدەن بـۆ زینـدوو کردنەوەی ئەم دەمارگیرییانەی کە ئیسلام خستییە ژێر خـاك و بـە شـان و باڵایدا هەڵ دەدەن و دروشمەکانی زیندوو دەکەنـەوەو شـانازی بـەو ماوەیـە دەکـەن کـە ئـەم دەمارگیرییانـە پێـش ئیسـلام رایـان بـواردووە، ئـــەو سەردەمەی کە ئیسلام سوورە لەسەر ئەوەی بە نەزانین و "نـــەفامی" نـاوی ببات کە لە فەرهەنگی ئیسلامدا هیچ دەربڕینێك نییـــە لەمـە تونـد تـر و ترسێنەرتر ، قورئانیش منەت لەسەر موسڵمانان دەکـات بـە دەرچوونیـان لەم سەردەمە نەفامییەو هانیان دەدات بۆ ئـەوەی سوپاسـی ئـەو نیعمەتـە بکەن کە پێیان دراوە و هیچ نیعمەتێکی تر نییە لەمە گەورەتر بێت،

﴿ وَاذْكُرُوا نِعْمَةَ اللهِ عَلَيْكُمْ إِذْ كُنْتُمْ أَعْدَاءً فَأَلَّفَ بَيْنَ قُلُوبِكُمْ فَأَصْبَحْتُمْ بِنِعْمَتِهِ إِخْوَاناً وَكُنْتُمْ عَلَى شَفَا حُفْرَةٍ مِنَ النَّارِ فَأَنْقَذَكُمْ مِنْهَا ﴾[5]. واتە: (بیری ئەو چاکە و نیعمەتە بکەن کە خوا لەگەڵی کردوون، کە ئێوە دوژمنی یەکتر بوون کەچی دڵی ئێوەی کرد بە یەك، کردوونی بە برا و ئێوە لەسەر رۆخی قۆرتێك بوون لە ئاگر کەچی ئێوەی رزگار کرد). ﴿ بَلِ اللهُ يَمُنُّ عَلَيْكُمْ أَنْ هَدَاكُمْ لِلإِيْمَانِ إِنْ كُنْتُمْ صَادِقِينَ﴾[6]. واتە: ( بەڵکو خوا منەتتان لە سەردەکات کە رێگای باوەڕی نیشان داون گەر ئێوە راستگۆبن). ﴿ هُوَ الَّذِي يُنَزِّلُ عَلَى عَبْدِهِ آيَاتٍ بَيِّنَاتٍ لِيُخْرِجَكُمْ مِنَ الظُّلُمَاتِ إِلَى النُّورِ وَإِنَّ اللهَ بِكُمْ لَرَؤُوفٌ رَحِيمٌ﴾[7]. واتە: (ئەو خوایەیە کە نیشانەی روون و ئاشکرا دەنێرێت بۆ پێغەمبەرەکەی تاکو ئێوە لە تاریکستانی دەربهێنێت بۆ رووناکی ، خوا لەگەڵ ئێوە زۆر بە بەزەیی و میهرەبانە).

## هەڵوێستی موسڵمانان بەرامبەر نەفامێتی و دروشمەکانی

شتێکی ئاساییە لای موسڵمان کە باسی نەفامێتی نەکات ، جا ئەو نەفامێتییە کۆن بێت یا تازە، مەگەر بە قین هەڵ گرتن و رق لێبوونەوەو رەنگ بزرکان و موچرك بە دڵداهاتن باسی بکات ، ئایا بەندکراوێکی ئازار دراو پاش بەرەڵاکردنی و بەربوونی کاتی بیری رۆژانی بەندکردن و

[5] سورة آل عمران /آية ١٠٣.
[6] سورة الحجرات /آية ١٧.
[7] سورة الحديد/ آية ٩.

ئەشکەنجەو سەرشۆڕی دەکاتەوە لەرز هەموو لەشی داناگریٚ؟! بەڵێ هەرچی ڕۆژگاری پڕ ئازار و تاریکی هەبووە هەمووی لیٚ نویٚ دەبێتەوە، ئایا کاتیٚ نەخۆشێك تووشی دەردێکی کوشندەی دوور و درێژ بووبێت و لە مردن نزیك بووبێتەوە، ئایا کاتیٚ بیری ڕۆژانی ڕابردووی نەخۆشییەکەی دەکاتەوە ڕەنگی هەڵنابزرکیٚ و حاڵی شپرزە نابیٚ؟! یا مرۆڤیٚ کاتیٚ خەونێکی ناخۆش و ترسناك دەبینیٚ ، ئایا سوپاسی خوا ناکات لەسەر ئەوەی کە ئەمە تەنیا خەون بوو و هیچی تر!! .

نەفامێتی هەموو ماناکانی گومڕایی و سەرگەردانیی و دووری لە ڕاستی و هەموو بەشەکانی تری زیانبەخشی لە دنیاو لە ڕۆژی قیامەت دەگرێتەوە، بەڵکو لە هەموو ئەمانەش گەورەترە، جیٚی خۆیەتی موسڵمان هەر کاتیٚ کە دێتەوە یادی ڕقی لە نەفامێتی و سەرگەردانی ببێتەوە، هەورەها سوپاسی خوای گەورە و میهرەبان بکات چونکە یارمەتی داوەو لە نەفامێتی ڕزگاری کردوەو ڕۆژگارەکەی بەسەر برد، جا بۆیە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (( ثلاث من كن فيه وجد حلاوة الإيمان: أن يكون الله و رسوله أحبَّ إليه مما سواهما وأن يحبَّ المرء لا يحبُّهُ إلاّ لله، وأن يكرهَ أن يعود الى الكفر كما يكره أن يقذف في النار )) واتە: ( سیٚ شت هەن هەرکەسیٚ تێیدا هەبێت ئەوا شیرینی باوەڕی چەشتووە، یەکێکیان ئەوەیە کە خواو پێغەمبەری لە هەموو کەس خۆشتر بویٚ ، دووەمیان ئەوەیە کەسێکی خۆش بویٚ تەنها لە پێناوی خوا، سیٚیەمیش پیٚی ناخۆش بێت بگەڕێتەوە بۆ کوفر هەروەکو پیٚی ناخۆشە فڕیٚ بدرێتە ناو ئاگر ).

هەروەها خوای گەورە زەمی نەفامێتی و پاڵەوان و ناودارەکانی کردووە

هەروەکو دەفەرموێ: ﴿ وَجَعَلْنَاهُمْ أَئِمَّةً يَدْعُونَ إِلى النَّارِ ويَوْمَ القيامَةِ لا يُنْصرونَ وَأَتْبَعْنَاهُمْ فِي هَذِهِ الدُّنيا لَعْنَةً وَ يَوْمَ القِيَامَةِ هُمْ مِنَ المقْبُوحِين﴾[8] واتە: ( ئێمە فیرعەون و داروودەستەکەمان کردن بە رێبەر و پێشەوا کە خەڵکیان بانگ دەکرد بۆ ئاگرو، لە رۆژی دوایی سەرناخرێن و لەم دنیایەش ئێمە لەعنەتمان بۆ ناردن لە رۆژی دواییش شەرمەزارو روورەش دەبن )

هەروەها دەفەرموێ: ﴿ وَ مَا أَمْرُ فِرْعَوْنَ بِرَشِيدِ يَقْدُمُ قَوْمَهُ يَوْمَ القِيَامَةِ فَأَوْرَدَهُمُ النَّارَ وَبِئْسَ الوِرْدُ المَوْرُودُ وَأُتْبِعُوا فِي هَذِهِ لَعْنَةً وَيَوْمَ القِيَامَةِ بِئْس الرِّفْدُ المَرْفُودُ﴾[9] واتە: ( رێباز و کاری فیرعەون لەسەر فام و تێگەیشتن نەبوو، پێشەوەی قەومەکەی دەکەوێ رۆژی دوایی بەرەو ئاگریان دەبات کە ئەم ئاگرەش خراپترین شوێنی مانەوەیە، و لە دنیاشدا لەعنەتیان لی دەکەین هەروەها لە رۆژی دواییش کە ئەمەش خراپترین بەخششە بۆیان ).

## گەورەترین مەترسییە رووبەرووی جیهانی ئیسلامی بۆتەوە

بەڵام زۆربەی وڵاتە ئیسلامییەکان و میللەتە موسڵمانەکان بە کارتێکردنی فەلسەفە و بیرکردنەوەی رۆژئاوایی وایان لیٚ هات رێز لە شارستانێتی و نەریتەکانی سەردەمی بابردووی پێش ئیسلام بنێن.. سۆزیان بۆ بچێتەوە و سوور بن لەسەر زیندوو کردنەوەی دروشمەکانی و نەمر کردنی پاڵەوان و قارەمان و پاشاکان و سەربەرزییەکانی بە جۆرێك وا

[8] سورة القصص/ آية ٤١-٤٢.
[9] سورة هود/ آية ٩٧-٩٩.

تێ دەگەن کە نەفامێتی چەرخی زێڕینە بۆیان و نیعمەتێکە ئیسلام لێیانی بێ بەش کردوون.. ئەمەش سەرگەردانی و بێ وەفاییە و نکۆڵی کردنە لە چاکەو ، ڕێز نەگرتنە لە نیعمەتی ئیسلام و چاکەی پێغەمبەر ﷺ و کەم کردنە لە زیانی کوفر و بت پەرستی و ئەو شتانەی کە لە نەفامیدا هەیە، لە ئەفسانەو شتی سەرلێ شێوین و گومڕاکەر و بێ مێشکی و کەم و پڕوپووچ ، کە هەندێکیان جێگای گریان و لە هەمانکاتیشدا جێگای پێکەنینیشن، جا ئەمانە لە موسڵمانێکی ژیر دوورن ، چونکە ئەمانە مەترسی بێ بەش بوون لە نیعمەتی ئیسلام و لێ سەندنەوەی باوەڕی لێ دەکرێت و هەروەها مەترسی بەر کەوتنی هەڕەشەی توندی خوای گەورەی لێ دەکرێ ، هەروەکو دەفەرموێ: ﴿ وَلا تَرْكَنُوا إِلى الَّذِينَ ظَلَمُوا فَتَمَسَّكُمُ النَّارُ وَ مَا لَكُمْ مِنْ دُونِ اللهِ مِنْ أَوْلِيَاءَ ثُمَّ لا تُنْصَرُونَ﴾[10]. واتە: ( پاڵ مەدەنە ئەو کەسانەی زاڵمن یاخود کافرن ئەگینا بە ئاگر دەسووتێن و بێجگە لە خوای گەورە پشتیوانتان نییە و سەرناکەون ).

## دەست بەردان لە ئایین و ڕەوشت

زیاتر لەمەش، ئەوەی ئەمڕۆ لە جیهانی ئیسلامیدا ڕوودەدات هەڵپە کردنی شێتانەیە بە دوای دەست کەوتنی ماددی و پەسند کردنی ئەو دەست کەوتە لەسەر هەموو مەبدەئو بیروباوەڕێکی تر، یا پەسند کردنی ژیانی دنیا لەسەر قیامەت و ڕووکردنە دنیاو شوێن کەوتنی هەواو نەفس

[10] سورة هود/ آية ١١٣.

ئەوەی کە لە دوای ئەمە هات لە بەرەڵلایی و سووك راگرتنی ئەو شـــتانەی کە خوا قەدەغەی کردوون ، سەرەڕای ئەمەش بڵاوبوونەوەی مەی و لە رێ لاچوونی چینە بەرزەکان ، بە جۆرێك وای لێهاتووە ئەم چینـــە لـە هـەموو وڵاتێکی ئیسلامیدا یەك دانەو یەك وێنە بن ، جگە لە هـەندێك کـە خـوا پاراستوونی ئەمانەش بە داخەوە زۆر کەمن . دەست بەردان و واز لێهێنان لە زۆربەی سنوورەکان و ئەرکەکانی ئیسلام واز لێهێنانێکی تەواو کـە وەك بڵێ ی ئەم چینانە هیچ پەیوەندییان بە شەریعەت و ئیسلامەوە نییـــە، وەك بڵـێ ی شـەریعەتێ بـێ لەکۆنـەوە هـەبووبێ و ئێـستا سـڕابێتەوە یـاخود چیرۆکێکی ئەفسانەیی بوبێت.

## شەپۆلێکی نەفامییە لە وڵاتە ئیسلامییەکان

ئەمە وێنەی جیهانی ئیسلامە لە بارەی ئایین و بیروباوەڕەوە، ئەمـــەش شەپۆلێکی نەفامییە سەرانسەری جیهانی داگرتـووە و گـەورەترین شـەپۆڵە کە جیهانی ئیسلامی تووشـی بووبێـت ، بـە درێژایـی مێژووەکـەی . لـە هەموو شەپۆلێکی تری بەربـەرەکانێ کـەری دژ بـە ئیســلام کـە مێـژووی ئیسلام ناسیبێتی تێپەڕی کــردووە، جـا چ لـە بـەتێنی بڵاویـداو ، چ لـە کاریگەرییەکەی لە سەر کۆمــەڵگای ئیســلامی.. ســەرەڕای ئەمــەش ئــەم شەپۆڵە نەفامییەی دوایی ، بەوە لەوانی پێشوو جیا دەکرێتەوە کە ئەوانەی ئاگادارن لێ ی زۆر کەمن و ئەوانەی خۆیان بۆ بەرەبەرەکانێ کردنی ئامـادە کردووە بە هەموو ئەو هێز و توانایەی کە هەیانە کەمترن ، جا هەرچــەندە کاتی خۆی بە هۆی کارتێکردنی فەلسەفەی یۆنانی زەندەقەو خــوا نەناســی

پەیدا بوو ، کە چی کەسی وای بۆ رەخسا بــە ژیـریی و زیرەکـی نایـابی و بەزانستی پاراو و لێکۆڵینەوەی فراوان و کەسایەتی بەتینــەوە بەربــەرەکانێ ی بکا، هەروەها لە ژێرەوە خوا نەناسەکان (الملحدون) پەیدا بوون ، کـەچی هی وا هەبوو کە بەربەرەکانێیان بکا بە زانیاری و پەند و بەڵگەوە. لەگـەڵ ئەوەشدا ئیسلام بەردەوام مایەوەو دەسەڵاتی ژیریی و پایــە زانیارییەکـەی خۆی پاراست ، کە بەو هۆیەوە توانی وەك کێـو و بەربەســت لــە بەرامبــەر هەر شەپۆلێکی بێ باوەڕی و کوفر بوەستێت ،

بەڵام مەسەلەکە تەنها مەسەلەی رەوشــت نزمــی و کـزی و لاوازی لــە خوا پەرستــی و وازهێنــان لەهێنانــەدیی دروشمــەکان و لاسـایی کردنــەوەی بێگانەکان نییە، هەرچـەندە ئـەم مەســەلانە پێویسـتییان بــە چـاودێری و جیهادە، مەسەلەی جیهانی ئیسلامی ئەمڕۆ ، زۆر گەورەترە لــە هــەموو ئەمانــە، جەنگــە لــە نێـوان ماددییــەت و یاسـا ئاسمانییــەکان ، ئـــەم جەنگەش رەنگە دوا جەنگ بێت لەنێوان ئایینی و نا ئایینیدا، جەنگێکــە کە چارەنووسی جیهان دەست نیشان دەکات.

## جیهادی ئەمڕۆ

بەڕاستی جیهادی ئەمڕۆ و جێنشــینی پێغەمبەرایــەتی و گــەورەترین قوربانی و چاکترین خواپەرستی ، بریتیە لە بەرگری کردنی ئەو شەپۆڵە بــێ ئایینییەی کە جیهانی ئیسلامی داگرتــووە و هێرشــی کردۆتــە ســەر بـیر و هــۆش و مەڵبــەندەکانیان . جـا بۆیــە پێویســتە ئــەو بڕوایــە وون بــــووە بگەڕێتەوە دەروونی گەنجەکان و چینە رۆشەنبیرەکان ، بــە هــۆی مــەبدەئو

بیروباوەڕ و ڕێباز و ڕاستییەکانی ئیسلام و بەهۆی پەیامی پێغەمبەر ﷺ .
پێویستە ئەو بیرشلەژان و دەروون شێواوییە لا ببرێت کە لە مێشکی گەنجەکاندا هەیە ، تاکو بە ژیریی و ڕۆشەنبیرانە ئیسلام وەرگرن و بەربەرەکانێ ی ئەو بنچینە نەفامییانە بکرێت کە لە دەروونی خەڵکا جێگیر بووەو بە شێوەیەکی زانستی و ژیرییانە دەسەڵاتی خۆی بەسەر مێشکیاندا داگرتووە، جا بۆیە پێویستە بنچینەکانی ئیسلام بە قەناعەت کردن و بڕوا هێنان و پەرۆشەوە شوێنی خۆیان بکەنەوە لە ناو دڵی گەنجەکان.

چەرخێکی تەواو بە سەرمانا تێپەڕیوە هەتا ئێستا ئەورووپا مێشکی زۆربەی گەنجەکانمان ئاو دەدات و تۆوی گومان و و خوانەناسی لەمێشکماندا دەچێنێت ، دووڕوویی و بێ بڕوایی لە بەرانبەر ڕاستییە باوەڕی و نەدیتراوەکان (الغيبيات) لە ناوماندا بڵاو دەکاتەوە . وامان لێ دەکات باوەڕ بێنین بەم فەلسەفە نوێیانەی کە لە بارەی ئابووری و ڕامیارییەوە ناردوویەتی ، ئێمەش دەستەوسان ماوین لە بەرگری کردنی و دەستەو ئەژنۆ دانیشتووین و شانازی بە کەلەپووری ڕابردووی ڕازاوەمان دەکەین و لە بەرهەم هێنانی شتی نوێ وەستاوین ، خۆمان لە فەلسەفەو بیروباوەڕی نوێ ی ئەورووپا گێل کردووە، چونکە بە شێوەیەکی ڕاست لێ ی ناکۆڵینەوە، تاکو سەرانسەر وەکو توێکار کردنی پزیشکە نەشتەرگەرەکان هەمووی هەڵبوەشێنینەوە، بەڵکو بە "داخەوە" خۆمان بە لێکۆڵینەوەی ڕووکەشی خێراو بە پەلە خەریك کردووە بۆ زیاد کردنی سامانی زانیاریی کۆنمان . تا لە ناکاودا جیهانی ئیسلام تووشی داڕووخان

بوو له رووی باوەڕەوە، وای لێهات جڵەوی کار له دەست وڵاتە ئیسلامییەکانەوە کەوتە دەست نەتەوەیەك کە هیچ باوەڕی بە مەبدەئەکانی ئیسلام و بیروباوەڕەکەی نییە، هەمیشە بۆی پەرۆش نییەو هیچ پەیوەندییەکی بە گەلی موسڵمانەوە نییە، تەنیا مەگەر بە "قەومییەتی ئیسلامیی" نەبێ، یاخوود بۆ بەرژەوەندییەکی رامیاریی! ئەم جۆرە عەقڵییەت و نەفسییەتە ماددی و بێ ئاینییانە دەستیان کرد بە بڵاو بوونەوە لە ناو جەماوەر لە رێگەی ئەدەبی و رۆشنبیریی و رۆژنامەگەریی و رامیارییەوە. تا وای لێهات گەلانی موسڵمان کە پڕ خێروبەرەکەت بوون ، چاکەکاری و ئامادە بوونیان لێ چاوەڕێ دەکرا و لە هەموو قەوارە ئادەمییەکانی تر چاکتر بوون لە جیهان ، کەوتنە ژێر دەستی ئەم چینە بە هۆی ئەم ژیریی و رۆشەنبیری و دەسەڵاتەی کە ئەو چینە هەی بوو. ئەگەر ئەم بارە بەم شێوەیە بمێنێتەوە، ئەو خراپەکاری و خوا نەناسییە تەشەنە دەکات بۆ ئەو میللەتانە و گشت کارگە و کێڵگەیەك دەگرێتەوە و بیریی بۆگەنی خۆی تێدا بڵاو دەکاتەوە، بەرەو رێگای بێ ئایینی و زەندەقەیان دەبات ، ئەمە بوو لە ئەورووپا روویدا ، هەمان شتیش لە رۆژهەڵاتدا روو دەدات ئەگەر هاتوو ئەم کارە رێڕەوە سرووشتییەکەی خۆی بگرێت و ویستی خواش بەرگریی لێ نەکات.

## سەرلەنوێ بەرەو ئیسلام

جیهانی ئیسلام زۆر پێویستی بە بانگەوازێکی ئیسلامی نوێ هەیە، کە بانگی بانگکەران و رەنجدەران تێیدا و ئامانجەکەیان ئەوە بێت "بەرەو

باوەڕ لە نوێوە"، جا لێرەدا هاوار کردن بەس نییە، بەڵکو پێویستمان بە نەخشەکێشانێکی ژیرانە هەیە پێش ئیش کردن ، پێویستمان بە بیر کردنەوەیەکی ورد و قووڵ و لەسەرخۆ هەیە تاکو بزانین چۆن ئەو چینە رۆشەنبیرەی کە جڵەوی کاریان بە دەستە، سەرلەنوێ بەرەو ئیسلام بگێڕینەوە؟ چۆن دەتوانین متمانەو دڵنیایی بەرانبەر بە ئیسلام لە دڵیاندا زیندوو بکەینەوە؟ چۆن رزگاریان بکەین لە بەندایەتی فەلسەفەی رۆژئاوایی و شارستانێتی ئێستاو تیۆرە ئایینییەکانی

## پێویستیمان بە پیاوانی دڵسۆز هەیە کە دوور بن لە مەبەستی تایبەتی

بێگومان پێویستمان بە کۆمەڵێك هەیە کە خۆیان بۆ ئەم بانگەوازە تەرخان بکەن و هەرچەند زانیاری و بەهرەو توانایان هەیە لە پێناوی ئیسلامدا بەخت بکەن ، بێ ئەوەی چاوبگێڕن بە دوای پلەو پایەو گەورەیی یاخود فەرمانڕەوایی رق و قین لە کەس هەڵنەگرن و سوودیان بۆ خەڵك هەبێت و خۆشیان بۆ سوود وەرگرتن ئیش نەکەن ، هەروەها دەبێ ببەخشن و وەرنەگرن و نابێ ئەم کۆمەڵە جێ بە چینێکی تر تەنگ بکەن لە شتێ کە ئەم چینە زۆری لا خۆشەویستە و بێ وچان لە پێناویدا ئیش دەکات و گیان و ژیانی خۆی لە پێناویدا بەخت دەکات ، نەوەك ئەمە ببێتە بەڵگەو بیانوو لە دەست ناحەزان و دەرگایەك بۆ شەیتان بکاتەوە، دەبێ دروشمیشیان دڵسۆزی و دوور کەوتنەوە بێت لە ئارەزوو پەرستی و خۆ پەرستی و دەمارگیریی

## ڕێکخراوی زانستیمان پێویسته

جیهانی ئیسلام پێویستی به ڕێکخـراوی زانسـتی هه‌یـه کـه ئامـانجی به‌رهه‌م هێنانی ئه‌ده‌بێکی ئیسلامی نوێ و بـه‌هێز بێـت کـه لاوی ئـه‌مڕۆ به‌ره‌و مانا فراوانه‌که‌ی ئیسلام بگێڕێته‌وه و لــه به‌ندایـه‌تی ئـه‌و فه‌لسـه‌فه ڕۆژئاواییانه ڕزگار یان بکات که زۆر له لاوه‌کانیان پاش ئاگادار بوونه‌وه‌و لێکۆڵینه‌وه باوه‌ڕیان پێ هێنــاوه، زۆربه‌شـیان بـه لاسـایی کردنـه‌وه‌و خـۆ به‌ده‌سته‌وه دان! جا بۆیه پێویسته سه‌ر له نوێ پایـه‌کانی ئیسـلام لـه دڵـی ئه‌مانه‌دا بچه‌سپێنین و مێشك و دڵیان ئـاو بده‌یـن ، بـۆ ئـه‌م مه‌به‌سـته‌ش پێویستمان به پیاوی ئیشکه‌ر هه‌یه له هه‌موو لایه‌نه‌کانی جیـهانی ئیسـلام که‌له‌سه‌ر ئه‌م جیهاده به‌رده‌وام بن . من هیـچ کـاتێك ئـه‌م رایـه په‌سـه‌ند ناکه‌م که ئایین و سیاسه‌ت "رامیاری" لێك جیاده‌کاته‌وه، یان ده‌ڵێت: ئایین له‌گه‌ڵ هه‌موو بارێك ده‌گونجێت و له هه‌وو شوێنێك دا ده‌ژی "هه‌رچه‌ند ئه‌و بـارو شـوێنه" دوور بێـت لـه ئیسـلام و یـان ئیسـلام له‌گـــه‌ڵ هــه‌موو کۆمه‌ڵگایه‌ك ڕێك ده‌که‌وێت ، له‌وانــه‌ش نیـم کـه رامیـاری بـه (الشـجرة الملعونة في القرآن- دره‌ختـی نـه‌فره‌ت لی ٚکـراو لـه قورئـاندا) نـاو ده‌بـه‌ن، به‌ڵکو من له پێشـــه‌وه‌ی هـه‌موو ئه‌وانـه‌م کـه داوای پـه‌یدا کردنـی بـیر و هۆشێکی رامیاری ڕاسته‌قینه ده‌کـه‌ن لـه نـاو گـه‌لانی موسـڵمان و پـه‌یدا کردنی سه‌رکردایه‌تییه‌کی مه‌زن و چاکه‌خواز ، له‌وانه‌م کـه باوه‌ڕیـان وایـه کۆمـه‌ڵگای ئیسـلامی ناهێنرێتـه دی ته‌نـها بـه بوونـی ده‌سـه‌ڵاتدارێکی ئیسلامی ڕاسته‌قینه و فه‌رمانڕه‌واییه‌کی ڕاست که له‌سه‌ر پایه‌کانی ئیسلام

دامەزرا بێت ، سوورم لەسەر ئەم داوایەم تاکو بە خزمەت خوای گەورەم دەگەم ، بەڵام مەسەلە تەنها مەسەلەی ڕێکخستن و پاش و پێش خستنە، یا ئەو داناییەی کە ئاین و تێگەیشتن لە ئاین"الفقه فی الدین" پێویستی دەکات ، یا بارو دۆخ فەرزی دەکات.

## تاقیکردنەوەکانی ڕابردوو

جا ئێمە ئەو هەموو هەوڵدان و بەهرەو وچان و هۆیانەی کە هەمان بوو لە بزووتنەوەی ڕامیاری و ڕێکخراودا بەختمان کرد ، لەسەر ئەو بنەڕەتەی کەوا میللەت خاوەن بڕوایەو ئەوەی پێشڕەوی دەکات و جڵەوی کاری بەدەستە " کەبێگومان ئەمیش چینی ڕۆشەنبیرە" بڕوای بە ئیسلام هەیەو بە پایەو بیروباوەڕەکانی ڕازییە و خوێن گەرمە بۆ داچەسپاندنی ئیسلام و فەراهەم هێنانی سنوورەکانی ، کەچی بە پێچەوانەی ئەوەی بۆی چووین وابوو ، بەڵکو بینیمان میللەت باوەڕی زۆر لاواز بووەو ڕەوشتی داکەوتووە و هاتۆتە خوارەوە بێ ئەوەی ئێمە یا میللەت هەست بەوە بکات، بیروباوەڕی ئیسلامیش لای زۆربەی زۆری چینی ڕۆشەنبیر باری کردووەو تواوەتەوە، بەهۆی فەلسەفەی ڕۆژئاوایی و ڕامیاری و دەست ڕۆیشتنەکەی، بە جۆرێك زۆربەی تاکەکانی ئەم چینە دژی بیروباوەڕی ئیسلامی هەڵساون و باوەڕیان هێنا بە فەلسەفەی ڕۆژئاوایی و ئەو شتانەی هێناویەتی لە بارەی بیر وباوەڕ و فیکرەوە کە زۆربەیان دژ بە ئایینن، کەچی ئەم بەڕێزانە! سەرگەرمن بۆی و سەری دەخەن و سوورن لەسەر جێبەجێ کردنی و بڵاوکردنەوەی و دەیانەوێ کاروباری ژیان لەسەر ئەم فەلسەفە

پوچەڵانە رێك بخەن و میللەت بەم فەلسەفانە ببەستنەوە، جا لێرەدا هەندێکیان ملهوڕن و بە پەلەن و هەندێکی تریان ژیرن و پێ بەپێ دەڕۆن ، کەچی هەندێکیان بە تۆزی بەسەر گەلیدا دەسەپێنن ، بەشێکی تریان هێمن و لەسەر خۆن ، بۆ گەلی دەڕازێننەوە، کەچی هەموویان یەك ئامانج و یەك مەبەستیان هەیە.

## بەشەکانی پیاوانی ئایین لە مامەڵەکردنی رۆشەنبیران

پیاوانی -ئایین ئەگەر ئەم دەربڕینە راست بێت چونکە لە ئیسلامدا "کەهەنووت" و چینێکی ئایینی دیاری کراو نییە- لەم بابەتەوە سێ کۆمەڵن:

کۆمەڵێکیان شەڕێکی کوشندە دژی ئەم چینە بەرپا دەکەن و بە کافر لە قەڵەمیان دەدەن ، لێیان دوور دەکەونەوەو لە هەمان کاتدا خۆیان گێل دەکەن لە گەڕان بە دوای ئەو هۆیانەی کەئەو ئاراستە ماددییەیان پەیدا کردووە، لەبنەما رۆشەنبیرییەکەیان ناکۆڵنەوە و خۆیان بە گۆڕینی ئەم ئاراستە پێچەوانەیەی کە بەربەرەکانێ ی ئیسلام دەکات خەریك ناکەن، هەوڵ نادەن ئەو دوورە پەرێزییەی کە هەیە بەرانبەر ئایین و پیاوانی ئایین لا بدەن ، هەوڵ نادەن ئەو نەختە خێر و باوەڕەی کە لای ئەو چینە هەیە زیاد بکەن و پەرەی پێ بدەن و بە ئەدەبێکی ئیسلامی چاك وکاریگەر ئاوی بدەن ، خۆیان بپارێزن لەوەی کە ئەو چینە هەیەتی لە ژیان و ماڵ و سامان وهێز و دەسەڵات و هەرگیز چاوی تێ نەبڕن ، هەمیشە کەمتەرخەمی نەکەن لە پێش کەش کردنی ئامۆژگاری دڵسۆزانە و

ڕێپیشاندانی ژیرانە.

کۆمەڵێکی تریان هاوبەشی ئەم چینە دەکات و بەشداری خێر و قازانجیان دەبێت ، سوود لەم چینە وەردەگرێ لە بارەی دنیاوە بێ ئەوەی خۆی هیچ سوودێکیان پێ بگەیەنێ لە بارەی ئایینەوە، جا دەبینی ئەمانە نە بانگەواز و نە بیروباوەڕ و نەغیرەتیان هەیە لەسەر ئایین و نەسوور دەبن لەسەر چاکەخوازیی ، هیچ پەیام و مەبەستێکی ئەوتۆیان نییە لە نزیک بوونەوەیان لەگەل ئەم چینەدا .

کۆمەڵەی سێیەم غەم و پەژارە دای گرتووە و بە بینینی ئەم حاڵە ئازار دەکێشێ و دان بەوەدا دەنێت کە ئەم چینە نەخۆشن و تیمار کردنیشیان زۆر گران نییە، هیوای چاك بوونەوەیان لیّ دەکرێت ، جا بۆیە دەبینین دەچن بۆ لایان و بە شێنەیی بانگیان دەکەن و بە جۆرێکی ئاقڵانە پەیامەکەیان پێ رادەگەیەنن و دڵسۆزانە ئامۆژگارییان دەکەن ، جا دەتوانی بڵێ ی ئەم جۆرە زانایانە ژمارەیان زۆر کەمەو بگرە هەر نین.

لەبەر ئەوە دەبینی ئەم چینە "رۆشەنبیرە!!" هیچ پەیوەندییەکی بە ئایین و ئاووهەوای ئایین نییە، زۆر ئاوارەو دوورە پەرێزن لیّ ی و رۆژ بە رۆژیش لە جاران زیاتر لیّ ی دوور دەکەونەوە بە جۆرێك گاڵتە بە هەموو شتێك دەکەن کە پەیوەندیی بە ئایینەوە هەبێت.

ئەو کۆمەڵەیەی یەکەم کە بەربەرەکانێ ی دەکات زیاتر وا لەم چینە دەکات لە ئیسلام دوور بکەونەوە، هەروەها کۆمەڵەکەی تریش کە ناوی ئیسلامی بەدەم گرتووە کەچی دەیەوێ فەرمانڕەوایی لەدەست ئەم چینە دەربێنێ و لەسەر پایەو گەورەیی ململانێ ی لەگەڵ بکات ، جا ئەم دوو

کۆمەڵە زیاتر وا دەکەن ئەم چینــــە قـین هـەلگری بەرامبـەر ئـەو کەسـەی ململانێ ی لەگەڵدا دەکات لەسەر شتی دنیایی ، کاتــێ ئـەو ئـادەمیزادە تـەنیا بـاوەڕی بـە دنیـا بێـت ، یـا ئـەو کەسـەی کـە فـــەرمانڕەوایی و دەسەڵاتداریی لیّ دەسێنێتەوە کاتێ ئەو کەسە تەنها لەسـەر فـەرمانڕەوایی و دەسەڵاتداریی دەژی ، یاخود ئەو کەســەی بیـەوێ هاوبەشـی بکـات لـە ماددەو ئارەزووەکانی کاتێ ئەو کەسە بێجگە لەمانە هیچی دیکە نەناسێ.

## ئەو کۆمەڵەی کە بۆ ژیاندنەوەی ئیسلامی نوێ پێویستە

وڵاتە ئیسلامییەکان ئەمڕۆ پێویستیان بە کۆمەڵێ هەیــە کـە خۆیـان دوور خەنەوە لە هەموو جۆرە تەماعکارییـەك و دڵســۆز بـن بـۆ بانگـەواز کردن و دوور بکەونەوە لە هەموو شتێك کەوا پیشـان بـدات ئـەم کۆمەڵـە مەبەستی دنیاو ماددە پەرستییە و مەبەستی دەست بەسەراگرتنی حوکمـە بۆ خۆی یا خێڵ و پارتەکەی ، هـەروەها پێویســتە ئـەو گـرێ دەروونـی و عەقڵییانەی کە رۆشەنبیری خۆر ئاوایی و ئەو هەڵانەی کە "پیاوانی ئـایین" تووشی هاتبوون ، ئەو ناحەزی و کوێرەوەری و دوورکەوتنەوەیە لـە ئیسـلام شی بکاتەوە بە هۆی یەکتر بینین و گفتوگۆ و نامەگەری و گەشـت کـردن ، بە ئەدەبی ئیسلامی چاك و کاریگەر و بە پەیوەندی تایبەتی و بـە دەسـت پاکی و رەوشت بەرزی و بە کەسایەتی بەهێز و بەدەست پاراستن لە شــتی بێ نرخی دنیایی و بـە ئـارەزووگرتن و بـەنواندنی رەوشـتی پێغەمبـەران و خەلیفەکانیان چارەسەریان بکات.

## لە مێژووی رابردوودا

ئەمەیە ئەو کۆمەڵەی کە خزمەتی ئیسلام دەکات لە هەموو چەرخێکدا، و فەزڵ و چاکەی گۆڕینی ئاراستەی دەوڵەتی بەنی ئومەییەو و دەرکەوتنی پێنجەمین خەلیفەی راشدین (عومەری کوڕی عەبدولعەزیز) و سەرکەوتنی بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە، هەروەها ئەم مێژووە خۆی دووبارە کردەوە لە سەردەمی پاشای مەغۆڵی مەزن (جلال الدین أکبر) کە دژی ئیسلام هەستاو سوور بوو لەسەر ئەوەی کیشوەری گەورەی ئیسلام -هیندستان- کە لەژێر سایەی فەرمانڕەوایی ئیسلامدا چوار سەدە ژیابوو بۆ نەفامێتی برەهمی بگەڕێنێتەوە، بەڵام بە هۆی هەوڵ و کۆششی ئەو بانگەوازە ژیرانەو دەرکەوتنی مرۆڤی ئیسلامخوازی نوێ خواز، و موسڵمانی[11] لێهاتوو و ژیر ، کە خۆی بۆ ئیسلام بەخت کردبوو و زۆر جوان لە بانگەوازەکەی گەیشتبوو ئەم کارە بەرپەرچ درایەوە، هەروەها زۆر جوانتر و بەهێز تر لە جاران ، بە کاریگەری قوتابییەکانی هیند بۆ ئیسلام گەڕایەوە و کۆتایی هات ، بە شێوەیەك ئەو پاشایانەی دوای (أکبر) هاتنە سەر تەخت لە چاکەو خۆشویستنی ئیسلام ، پلەپلە چاکتر دەبوون ، تا وای لێهات پاشایەك هاتە سەر تەخت کە مێژووی ئیسلام و مێژووی چاکەخوازی بە ناو هێنان و قسەکانی ئەو برازێتەوە.

---

[11] ئەوەیش ئیمام أحمد کوڕی عبدالأحد سەرهەندی بوو کە لەنێوان سالانی ٩٧١ك ١٠٣٤ز ژیاوەو خاوەنی (الرسائل الخالدة)یەو، خاوەنی رۆڵێکی گەورە بووە لە سەر کردایەتی چاکە خوازی و نوێخوازیی ئیسلامی.

## پێویستییەکەو دواخستنی بۆ نییە

ئەمەش پێویستییەکە بە هیچ کلۆجێك دواخستنی بۆ نییە مەگەر تەنها رۆژێکیش بێت ، چونکە جیهانی ئیسلامی ئەمڕۆ دووچاری شەپۆلێکی هەڵگەڕانەوەی زۆر توند بووە، کە لەناو ئازیزترین رۆڵەکانی و بەهێزترین بەشەکانیدا بڵاو بۆتەوە، ئەمەش شۆڕشێکە و دژی خۆشەویستترین شت کە جیهانی ئیسلامی هەیبێت لە بیروباوەڕ و رەوشت و بایی یەکان (قیم). چونکە جیهانی ئیسلامی مانەوەی بۆ نییە پاش ون کردنی ئەم سامانەی کە پێغەمبەر ﷺ بەجێی هێشتووە و نەوەکانی دوای ئەو بە میرات بۆیان ماوەتەوە و پاڵەوانەکانی ئیسلام لە پێناویدا جیهادیان کردووە، دەبا ئەمڕۆ ئەم باسە ببێتە جێی لێکۆڵینەوە بایەخ پێدانی هەموو ئەوانەی غەم خۆری ئیسلامن.

وآخر دعوانا أن الحمد لله رب العالمين

# ناوەڕۆك

